حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings



# پەروەردەی ئیسلامی

## بۆ پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی



تان

و

ب... گرام و چاپەمەنییەکان




# پەروەردەی ئیسلامی

## پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی

**ئامادەکردنی**

عبداللە عبدالرحمن بابان     واحد حمە صالح     ئازاد عمر سيد أحمد

**پێداچوونەوەی زانستی**

د.بشير خليل توفيق

ابوبكر على كاروانى

**وەرگێڕانی**

صادق عثمان عارف سازانى

**پێداچوونەوەی زمانەوانی**

سادق ئەحمەد عوسمان روستایی


چاپی دووەم     ١٤٣٧ کۆچی     ٢٧١٦ کوردی     ٢٠١٦ زایینی



# پێشەکی

پەروەردەکارانی بەڕێز، ئەم پەرتووکە هەنگاوێکی دیکەی گۆڕینی پەرتووکەکانی بابەتی پەروەردەی ئیسلامییە، بە پێی ئەو پلانەی وەزارەتی پەروەردە بۆ گۆڕینو پێشخستنی پرۆگرامی ئەم بابەتە، کە گرنگییەکی زۆری هەیە لە دروستکردنی کەسایەتی تاك بە شێوەیەکی زانستیو رەنگڕێژکردنی بە شێوەیەکی پەروەردەیی، بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی کۆمەڵگە بە تاکی بەسوود، بۆ ئەوەی بەشداری بکەن لە بنیاتنانیو بە هێزکردنی بناغەکەی، بۆ دابینکردنی دوا رۆژێکی پرشنگدار.

وەك لە پەرتوکی پۆلەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد، گۆڕانکارییەکی بەرچاو هەیە لە خستنە رووی بابەتەکان بە بەراورد لە گەڵ پەرتوکەکانی پێشوودا، چ لە ناوەرۆكو چ لە ئامانجو راهێنانەکاندا، پەروەردەکارانی بەڕێز بۆیان هەیە لە شیکردنەوەی بابەتەکاندا زانیاری زیاتر ببەخشن بە قوتابییانو خوێندکارانو مەرج نییە تەنها پابەندی وانەکانی کتێبەکە بن، چونکە دابەشکردنی کتێبەکان بۆ ئەو وانەو وەرزانە بە مەبەستی رێکخستنی پەرتووکەکەیە، بۆیە بۆیان هەیە مەودای سود وەرگرتن لە بابەتەکان فراوانتر بکەن.

هیوادارین پەروەردەکارانی هاوکارمان هەر تێبینییەكو سەرنجێکیان هەبێت لە کاتی جێبەجێکردنی کارەکانیان بە شێوازی پراکتیکی ئەم پرۆگرامە و بە مەبەستی دەوڵەمەند کردنی بۆمان رەوانە بکەن، بۆ ئەوەی لە چاپەکانی داهاتوودا سودیان لێ وەربگرین، چونکە گومانی تێدا نییە کە هەر کارێكو پرۆسەیەك بێ کەمو کوری نابێت.

خودا پشتیوانی سەرکەوتنمانە....

لیژنەی ئامادەکار

## لە ناوە پیرۆزەکانی خودای گەورە

**المهيمن** : بە توانایەو تەواوی دەسەلاتی بەسەر گشت درووستکراوەکانیدا هەیە.

**العزيز** :بەتوانا و دەسەلاتدارە هەموو بونەوەرەکان پێویستیان پێیەتی

**الجبـار** : ویستی خۆی بەسەر هەموو بونەوەراندا جێبەجێدەکات.

**المتـكبر** : گەورەیەو خۆی بەگەورە دەزانێت

**البارىء** : دروستکەری بوونەوەرە بەبێ وێنەی پێشوەخت.



## پشت بەستن بەخودا

یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) چووە ناو مزگەوتەکەی دیتی منداڵێکی تەمەن خوار دە (١٠) ساڵان بە ملکەچییەوە نوێژی دەکرد ، ئەویش لە دوای نوێژی سوننەتی چونە مزگەوت لە منداڵەکە چووە پێش و سڵاوی لێکردو لێی پرسی: تۆ کێیت ؟ کوڕی خۆم :منداڵەکە کەمێك راماو گوتی : مامە گیان ، من منداڵێکی بێ باب و دایکم. هاوەڵەکە زۆر دڵی پێ سووتا گوتی : ((باشە رازی دەبی ببیتە کوڕی من ؟)).

لێرەدا منداڵەکە ژیرانە ئەم چەند پرسیارەی ئاراستەکرد : مامە گیان ، ئەگەر برسی بووم خۆراکم دەدەیتێ ؟ گوتی :بەڵێ . ئەی ئەگەر پۆشاکم پێویست بوو بەرگم بۆ دەکری ؟گوتی :بەڵێ . منداڵەکە دیسان پرسی : ئەی لە نەخۆشیدا چارەسەرم بۆ دەستەبەر دەکەیت ؟ هاوەڵەکە گوتی : ئەوەیان بە دەست من نییە . ئەویش پرسی : ئەی پاش مردن دەتوانیت زیندوم کەیتەوە ؟ هاوەڵ :ئەویش تەنها بە دەست خوایە .ئەوجا منداڵەکە گوتی : کەواتە مامی بەرێزم ، لێم گەرێ با تەنها پشت بە خوای میهرەبان ببەستم کە دروستی کردووم رێنماییم دەکات ، رۆزیم دەداتێ و تێرم دەکات ، لە ناساغیشدا چارەسەر هەر لای خۆیەتی و هۆکاری چاکبوونەوەی بۆ بەدیهێناوین . پاشان مردن و زیندو کردنەوەش تەنها بە دەست ئەوە و هەر ئەویشە لە تاوان و هەڵەکانمان دەبورێت.. لێرەدا هاوەڵەکە نزای بۆ ئەو منداڵە ژیرە کرد و سوپاسی خوای کرد لەسەر باوەڕە پتەوکەی و ، گوتی راستە ، هەر کەس بەراستی و دڵنیاییەوە پشت بە خوا ببەستێ ، تەنها ئەوی بەسە.



**دەرئەنجام:**

لەم چیرۆکە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە مرۆڤ هەردەم دەبێت پشت بە خودا ببەستێت، چونکە هەر ئەو بە تاکو تەنها چاودێری مرۆڤ دەکاتو هەرچی بییەوێت دەبێت لەوی داوا بکات، وەك لە قورئاندا هاتووە:((ومن يتوكل على الله فهو حسبه)) (الطلاق).

**گفتوگۆ:**

قوتابی خۆشەویست بەهاوکاری مامۆستا ئەم رستەو ئایەتانەی خوارەوە لێکبدەنەوە:

١- خوای گەورە دەفەرموویێت:(( اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ)) (التغابن١٣).

٢- " خودا بەتەنها بەسە بۆ ئەوانەی پشتی پێدەبەستن" رونی بکەوە.

٣- پەند لەو چیرۆکەی سەرەوە چییە ؟ رونی بکەوە.

٤- تۆش بەسەرهاتێك بگێڕەوە پشت بە خوا بەستنی تێدا بەر جەستە بووبێت.



## سورەتی ئەلمەسەد ( المَسَد )

بسم الله الرحمن الرحيم

(( تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ١ مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ٢
سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ٣ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ ٤ فِي جِيدِهَا
حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ٥ ))

صدق الله العظيم

**واتە:**

((تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ))ئەبو لەهەب هەردوو دەستی بەبڕین بچێت و ریسوابێت.

((مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ))نەسامانی و نە ئەوەی پەیدای کردووە فریای نەکەوت.

((سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ))لە ئایندەدا ئاگری بە گڕ ئەیسوزێنێ.

((وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ)) هەروەها ژنەکەشی کە دار بەکۆڵ دێنێ.

((فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ))گوریسێکی چنراو لە پوشی خورمای لەملدایە.

## چیرۆکی هاتنە خوارەوەی سورەتەکە:

سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە، کاتێك خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:(( وَأَنذِر عَشيرَتَكَ الأَقـرَبينَ)) پێغەمبەر (دخ) هاتە (سەفا) بانگی راهێشت، خەڵکی لێی کۆبوونەوە، ئەویش فەرموی: ئەی بەنی عەبدولموتەلیب ئەی بەنی فیهر ئەی بەنی لوئەی ئەگەر پێتان رابگەیێنم کە لەشکرێك لە پشت ئەم چیایە هەیەو دەیەوێت هێرش بکاتە سەرتان باوەڕم پێ دەکەن؟ گوتیان: بەڵێ. ئەویش فەرموی: من ئاگادارکەرەوەم بۆ ئێوەو سزایەکی توند چاوەڕوانتانە گەر باوەڕ نەهێنن، ئەبو لەهەبی مامی گوتی: نەفرەتت لێ بێت تا کۆتایی ئەمڕۆ، ئەمە چییە ئێمەت بۆ بانگ کردووە. بۆیە خودای گەورە ئەم سورەتەی هێنایە خوارەوە.

**گفتوگۆ:**

١ – ئەبو لەهەب کێیە ؟

٢ – (حمالة الحطب) کێیە ؟

## وانەی چوارەم

## چەند نموونەیەك لە كاری بەسوود و باش

-١-

### هاندان بۆ فێربوون



بەهمەن و سیروان سەبارەت گرینگیدانی ئایینی ئیسلام بە فێربوون و هاندانی موسڵمانان بۆ ئەو كارە بەسوودە پێكەوە گفتوگۆیان دەكرد. بەهمەن بە سیروانی گوت : هاوڕێی خۆشەویستم بۆ ئەوەی دوا نەكەوین لە وانەكانمان ، با زوو بچین بۆ قوتابخانە ، بەراستی زانیاری باش فێربووین ، پێویستە بەردەوام بین سیروان گوتی : تۆ پێت وایە بە درێژەدان بە خوێندن ئامانجێك بە دەست دێنین بەهمەن: بەڵێ، چونكە هەر زانستە پلەی مرۆڤ و ناوبانگی بەرزدەكاتەوە ئەوەتا بەرهەمەكانی زانست و خوێندن هەموو بوارێكی ژیانی گرتۆتەوە ، وەك وزەی كارەبا كە بۆ روناكی و گەرمكردن و فێنككردنەوە بەكاردێت . هەروەها ئامێری تەلەفزیۆن و كۆمپیتەر و سودەكانیان، ئۆتۆمبیل و فرۆكە بۆ گواستنەوە. لەلایەكی ترەوە زانستی پزیشكی بۆ تەندروستی و چارەسەری نەخۆشی . ئەمانەو گەڵێ شتی دیكە ، هەمووی بەرهەمی خوێندن و قوتابخانەن.

سیروان گوتی : هاوڕێم ، هەموو ئەمانە مەبەستن و بە نرخن ، كەواتە تۆ راست دەكەیت پێویستە خۆماندو بكەین بە دوای زانستدا بگەڕێین تا لە ژیاندابین بەڵێن بێت لە قوتابخانە دوا نەكەوم ،

هەرچیم نەزانی پرسیار بکەم کۆلنەدەم لە خوێندن تا پێکەوە لە دوا رۆژ خزمەتی خاك و نەتەوەکەمان بکەین.

بەهمەن گوتی : من لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتێکم دیاریکردوە مرۆڤەکان هاندەدا بە دوای زانستدا بگەڕێن با لە ئاسمانیشدا بێت ، وەك دەفەرمووێت:(( يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ ﴿٣٣﴾ )) (الرحمن٣٣).

سیروان گوتی : لەبەر رۆشنایی و رێنمایی ئەم ئایەتەدایە مرۆڤ بە دوای نهێنی و شاراوەکانی زەوی و ئاسماندا دەگەڕێت. هاورێم ، وانییە؟

بەهمەن :بەڵێ ، وایە. هەر لە رێی زانستەوە مرۆڤ لەم سەردەمەدا توانی بگاتە بۆشایی ئاسمان و هەموو ئەمەمان بینیوە.

سیروان : ئەمەش بەڵگەیەکەکی بەهێزە لەسەر بەدەستهێنانی زانست.

بەهمەن :دەزانی ، زانست سودی دیکەی زۆرە ، وەك:

زانست فێرمان دەکات چۆن پەروەردگار بناسین.

هەر بە زانست و زانیاری هەمە جۆر لە گشت بوارەکانی ژیان فێر دەبین.

چەکێکە بەرامبەر نەزانی و دوا کەوتویی.

بەهۆی زانستەوە دەگەینە داهێنان و ئاسۆیەکی رون بۆ ئایندەمان.

هۆی پێشکەوتنی گەلانە.

ئەو روناکییەیە کە نهێنییەکانی بونەوەرو ژیان ئاشکرا دەکات.



## گفتوگۆ

١-

أ- بەهمەن چی بە هاوڕێکەی گوت ، لە سەرەتای گفتوگۆکەدا؟

ب- ئایا فێربوون و خوێندن پێویستە بۆ گشت کەسێك؟

پ- بۆ چ مەبەستێك مرۆڤ هزری خۆی دەخاتە کارو ماندوو دەبێت؟

ت- ئەو ئایەتەی هانمان دەدات بۆ گەڕان بە دوای نهێنییەکاندا ، لەبەر بڵێ.

٢- ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی مەبەست پڕبکەوە:

مرۆڤ سود لە تەلەفزیۆن بۆ ............... و ...............دەبینێت ، لە ئۆتۆمبێلیش بۆ ............... وەک زانستی پزیشکی و دەرمان بۆ ............... .

٣- لە ستونی یەکەم و دووەمدا بڕگە گونجاوەکان بە یەك بگەیەنە:

ئ- مرۆڤی خوێندەوار ............................... سەر لە نوێ ژیاوەتەوە.

ب- گەر مرۆڤ دووربێت لە خوێندن و فێربوون ............... خۆی کێشەکانی چارەسەر دەکات.

پ- گەلی کورد ............................... لە ڕەوتی شارستانیەت بەجێ دەمێنێ.

٤- مەشق بەخۆم دەکەم:

ئ- بەخەت و ڕێنوسی جوان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (د.خ) بنوسەوە:

"طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة"

ب-وێنەی کەوانی مانگ بکێشە.

## چالاکی

باس بکە ، چۆن بەهمەن توانی ....... بایەخی زانست لە کۆتایی گفتوگۆکەیاندا بۆ هاوڕێکەی شیبکاتەوە.

-٢-

## کردەوەی چاکەو پاداشتی



مامۆستای پەروەردەی ئیسلامی بە قوتابییانی گوت : ئازیزانم : ئەمڕۆ سەبارەت بە کاری چاکە و کاریگەری لەسەر تاك و کۆمەڵ دەدوێین . بۆیە قوتابییەك پرسی : مامۆستا : واتای کردەوەی چاك چییە؟

مامۆستا : چاکە ئەوەیە مرۆڤی موسڵمان کاری سود بەخش و باش ئەنجام بدات کەڵکی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی ، هەروەها وەڵامی خراپ بە چاك دانەوەش هەر چاکەیە و خوا فەرمانی پێکردوە.

قوتابییەکی دیکە پرسی : باشە ، مامۆستا ، سودی کاری چاکە چییەو ، چەند نموونەیەکمان پی بڵێ؟

مامۆستا گوتی : تاك و کۆمەڵ ئاسودە دەکات ، خوا لە خاوەنی کردەوەی باش رازی دەبێت ، وەك یارمەتیدانی یەکدی ، سەردانی نەخۆش ، هەرەوەزکردن بەخشین ، رووی خۆش، سادەیی ، رێزی گەورەگرتن ، زمان پاراستن لە باسی ئەم وئەو ، چاکەت بۆ هاوڕێیانت بو ێت.......... هتد.

قوتابی سێیەم : زۆر سوپاس ، مامۆستا ، بەراستی وتەکانت بەسوود بوو. ئێمەش بەڵێن دەدەین هاوکاری یەکدی بکەین و هیوادارین تۆش سەرکەوتو بیت.

## گفتوگۆ

لەگەڵ مامۆستادا ئەم رستانە شیبکەنەوە :

کەی پێمان دەڵێن مرۆڤی چاك ؟

ئەم ئایەتە شی بکەوە:(( وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّه إِنَّ اللّه شَدِيدُ الْعِقَابِ )) (المائدة٢ ).

ئەم ئایەتە لێك بدەنەوە:((ادفع بالتى هى أحسن السيئة)) المؤمنون/٩٦.

## چالاکی:

ئەم فەرموودەیە لە بەر بکە:

(( الله في عون العبد مادام العبد في عون اخيه ))



## ڕەوشتی پەسەند

پرسیار لە کەسێکی دانا کرا سەبارەت ڕەوشتە پەسندەکان، ئەویش گوتی: ئەگەر مرۆڤ خاوەن ڕەوشت بوو ، ئازار بەخش نەبوو، چاکە خواز بوو، ڕاستگۆ و ڕەفتار باش بوو ، سەرکێشی و هەڵەی کەم بوو ، بە ئەمەك و ئارام و سوپاسگوزاری خوا و پەیوەست بوو بەکەس و کارەوە هەروەها بە قەناعەت و پشو درێژ و میهرەبان وداوێن پاك بوو ، لێبوردە و بێ کینە و بەخشندە و دەستکراوە بوو. مرۆڤێك بوو لەبەرخودا کەسێکی دەویست و هەر لەبەر خوداش پشتی لێ هەڵئەکرد، ئەوا ئەو مرۆڤە کەسێکی بە ڕەوشتە . ئێمەش زۆر بەوە ئاتاجین بە بیری خۆمان و یەکدی بهێنینەوە کە ڕەوشتی بەرز پێگە و پایەی بڵندی لە ئاییەنەکەماندا هەیە وا لە خوارەوە چەند فەرموودەیەکی سەروەرمان محمد (د.خ) لەسەر ئەم بابەتە بە نموونە دەهێنینەوە :

ئوسامەی کوڕی شورەیك دەڵێت : لە خزمەت پێغەمبەر دابووین ، کەسمان ورتەی لێنەدەهات وەك باڵندە هێلانەی بەسەر سەرمانەوە کردبێت ، چەند کەسێك هاتن بۆ لای و پێیان گوت : ئەی پێغەمبەری خوا ، کام جۆر لە بەندەکان لای خوا خۆشەویستترە ؟ فەرمووی : ((خاوەنی باشترین ڕەوشت )) . لە ریوایەتێکی تردا : پرسیان ((باشترین ئاکارێکی ئادەمیزاد چییە ؟)) فەرمووی: ((ڕەوشتی جوان و پەسەند)) . هەروەها فەرموویەتی (د.خ) :((ان الفحش و التفحش لیسا من الاسلام في شئ و ان احسن الناس اسلاما احسنهم خلقا)) . واتە : ((بێ ئابڕویی و جوێنبازی لە ئیسلامدا جێی نییە ، باشترین نیشانەی موسڵمانێتیش ڕەوشتی بەرزی تاکەکەیە )) . دیسان پرسیاری لیکلرا (د.خ): ( باوەڕی کام لە باوەڕداران تەواوترینیانە؟ فەرمووی ئەوەی خاوەنی بەرزترین ڕەوشتە).

### دیسان لە ڕەوشتە بەرز و پەسندەکان :

١ – دراوسێیەتی باش و خۆش مامەڵە کردن لەگەڵیان.

٢ – گوێرایەڵی دایباب.

٣ – ڕێز لە گەورەگرتن و سۆز بەخشین بە بچوك.

٤ – یاریدەدانی کەسانی دیکە.

٥ – ڕوو گەشیو وتەی چاك.

**گفتوگۆ:**

پابەند بوونی مرۆڤ بە رەوشتی بەرزەوە ، دەبێتە مایەی رێزگرتن. ئەم دەستەواژەیە روون بکەوە.

**چالاکی:**

ئەم فەرموودەیە لەبەر بکە: (( انما بعثتُ لأُتمَّم مكارم الاخلاق )).



## ئاین واتە ئامۆژگاری و بەدەنگەوەچوون



موسوڵمانان لە نێو خۆیانا چەندین ئەرك و مافیان لەسەر یەکدیە، پێویستە پابەندیان بن بە پێی توانا، موسوڵمان بە باوەڕداری تەواو ناژمێردرێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە ، بۆ برا موسڵمانەکەشی پێی خۆش نەبێت لەو مافانەی نێوانیان (ئامۆژگاری) یە:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕێتەوە ، کە فەرموویەتی: ((لایؤمن احدکم حتی یحب لاخیه مایحب لنفسه)) (متفق علیه) .

مەرجی باوەڕداریی تەواو بۆ تاکی موسڵمان ئەوەیە بۆ خۆی چی لا خۆش و بە کەڵکە لە کاری چاك و پەرستش و هەر پێداویستیەك ، بە هەمان ئەندازە شاد ببێت کاتێك برایەکی موسڵمانی بەهەر کام لەو ئاواتانە دەگات . کۆڵیش نەدات لە ئامۆژگاریکردن و بە تەنگەوە هاتنیان.

قوتابییانی خۆشەویست ، ئامۆژگاری ، ڕێبازی پێغەمبەران (د.خ) بوە بۆ گەیاندنی پەیامەکانیان، ئەوە بوو موسا ، نوح ، هەروەها عیساش (درودی خوایان لەسەر بێت) بە ئامۆژگاری و دڵسۆزی بۆ کۆمەڵگەکانیان هەڵدەستان و بەو شێوەیەش ئاینی خوایان دەگەیاند.

پێغەمبەریشمان (موحەممەد) (د.خ) بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام ڕێبازی ئامۆژگاری و ڕێنمایی پەیرەو دەکرد و بەڵێنی لە هاوەڵانی وەردەگرت کە بۆ یەکتر دڵسۆزبن و بە تەنگ موسڵمانانەوە بن و هەردەم بە دەنگ یەکەوە بچن کۆڵنەدەن. جەریری کوری عەبدوڵڵا (خ.ر) گوتی : بەڵێنم بە پێغەمبەر (د.خ) دابوو لەسەر ئەوەی نوێژ بکەم و زەکات بدەم ، هەروەها دڵسۆزبم بۆ گشت موسڵمانان و لە ئامۆژگاریکردن دەست هەڵنەگرم .(کۆڕای لەسەرە) . هەر لەبەر گرنگی بە تەنگەوە: هاتنی یەکتر بوو کە فەرمان درا موسڵمانان لە یەکتر بە ئاگابن ، ئامۆژگاریش بەرهەمی دڵسۆزیە و نیشانەی ئەوەیە تۆ خێر و خۆشیت دەوێت بۆ براو خوشکە موسڵمانەکان.

**- دڵشاد بە باوکی گوت:**بەڵام هەندێك کەس لەم فەرمانە دوا دەکەون ، تاوان دەبینن خۆ بێدەنگ دەکەن ، بەو بیانوەی ئەمە ئەرکی ئەوان نییە لە بیری دەکەن کە ئامۆژگاریکردن بە دڵسۆزیەوە ئەرکی موسڵمانانە لە نێو خۆیانداو هەموان دەگرێتەوە.

**باوکی گوتی:** پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی ((الدین النصیحة.قلنا لمن؟قال:لله ولرسوله ولأئمة المسلمین وعامتهم)) موسلیم گێراویەتەوە.

ئەم فەرمودەیە ڕێنمایە بۆمان کە دڵسۆزی و بە دەنگەوە چون پێویستە لەسەر موسڵمانان ، ئەوەشە پایە و ڕاگری ئاین . بەرانبەر خوای گەورە بریتیە لە لێبڕاوی بۆ پەرستش و باوەڕ پێوی، بۆ پێغەمبەر و پێشەوایانی ئاین گوێرایەڵیەوە بۆ موسڵمانان بە گشتی دڵسۆزی و ، ئامۆژگاری یەکترە.

بەڵام کەی و بۆچی و چۆن و بۆ کێ ئامۆژگاری (دڵسۆزی) بەکاردێنن؟ چونکە نابێت کەسی ئامۆژگار بە شێوازی ڕەخنەو توندگیری مەبەست بگەیەنێ یان بۆ بەرامبەر مل بەراستی نەدات و نکوڵی بکات ، یاخود کەسانێك هەبن پێویستیان بە هاوکاری و ئامۆژگاری بێ ، بەڵام کەس نەبێ لێیان بپرسێتەوە. ئەمانە هەموو پێویستیان بە چارەسەرە.

**گفتوگۆ:**

- راشکاوانه بڵێ، ئەگەر چویتە شوێنی گشتی بۆ نموونە بازاڕ، کاری هەڵەو نارەوات (ناشەرعی) دیت چی دەکەی؟

- ئەگەر بۆ کۆڕێك بانگهێشت کرای، باسی ئەم وئەوی تیا دەکرا، هەڵوێستت چی دەبێ؟

**چالاکی:**

هیچ رووداوێکت بەسەر هاتووە برادەرێکت یان خزمێکت ئامۆژگاری کردبێت؟ باسی بکە بۆ مامۆستاکەت.



## ئادابی سڵاوکردن



لە هێما و ئاماژە گرنگەکانی ئیسلام. سڵاوکردنە لە یەکدی ، چونکە بەهۆیەوە ئارامی و دڵنیایی لە نێوانیاند بەرپا دەبێت و دەروون پاکدەکاتەوە و کینە و زیزبوون لە ناو دەبات. بۆیە موسڵمان بۆی نییە پتر لە سێ رۆژ زیاتر قسە لەگەڵ موسڵمان نەکات لە کاتی زیزبووندا ، باشترین کەسیش لای خوا ئەو کەسەیە دەست پێشخەری دەکات لە سڵاوکردن و ئاشتبوونەوەدا. خودای گەورە دەفەرموێت: (( وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا)) (النساء ٨٦).

سڵاوکردن ئادابی تایبەتی هەیە وەك پیادە سڵاو لە دانیشتوو دەکات ، سوار لە پیادە ، کەم لە زۆر یان تاك لە کۆ. شێوازی سڵاوکردن زۆرە بەڵام سڵاوی مرۆڤی موسڵمان بەم شێوەیە پەسەندترە:

(سەلامی خودات لێ بێت) وەڵامەکەشی (سەلامی خودا لە تۆش بێت).

**گفتوگۆ**

مرۆڤ چ هەستێکی لا دروست دەبێت کاتێك کەسێك سڵاوی لێدەکات؟

پاداشتی ئەو کەسە چییە کە دەست پێشخەری لە سڵاوکردندا دەکات ؟

بە هاوکاری مامۆستاو قوتابییان شێوازەکانی (ئادابی) سڵاوکردن نمایش دەکەن.

**چالاکی :**

ئەم فەرموودەیە لەبەر بکە:(( أَلا أَدلُكُم عَلَى شيءٍ أَن فَعلتموهُ تَحَابَبْتم، أَفْشوا السَّلامَ بَيْنَكم)).




ئاو ژیانە

پاراستنی ئاو ئەرکێکی نیشتمانی و ئاینییە

## سورەتی هومەزە (الهمزة)

### بسم اللّه الرحمن الرحيم

(( وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ١ الَّذِى جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ ٢ يَحْسَبُ أَنَّ
مَالَهُ أَخْلَدَهُ ٣ كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِى الْحُطَمَةِ ٤ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ ٥
نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ ٦ الَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ ٧ إِنَّهَا عَلَيْهِم
مُّؤْصَدَةٌ ٨ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ٩ )).

صدق اللّه العظيم

**راڤه :**

((وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ)) هاوار بۆ كەسێك تانەو تەشەر لە خەڵك دەدات.

((الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ))ئەوەی ماڵی كۆكردەوە و هەردەم دەیژمێرێت.

((يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ))خەیاڵ دەكا دراوەكەی لە مردن دەیپارێزێ.

((كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ))نەخێر، با وا خەیاڵ نەكا" بێ گومان بەریسوایی فڕێ دەدرێتە ناو (حوتەمە)وە.

((وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ))كوا دەزانی نیاز لەو (حوتەمە) چییە؟

((نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ))ئاگرێكە خودا هەڵیگیرساندیە.

((الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ))بەسەر دڵاندا دێ.

((إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ))لەشوێنێكدایە داخراوە لەسەریان.

((فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ))لە ئەستوون گەرێكی ئاگرینی درێژكراوە دان.

**سود :**

ئەم سورەتە لە مەكە هاتۆتە خوارەوە،نۆ ئایەتەو ڕیزبەندیشی سەدو چوارە، لە دوای سورەتی قیامە هاتۆتە خوارەوە، بەوەش دەست پێدەكات كە نزا لەو كەسانە دەكات كە تانە لە خەڵك دەدەن.

**گفتوگۆ :**

- ئەو وانانە چین كە لەم سورەتە بە دەست دێن.

وانەی دەیەم

## چەند دیمەنێك لە ژیانی پێغەمبەرمان (د.خ):

### میهرەبانی پێغەمبەر (د.خ) بەرامبەر منداڵان

دوای ئەوەی باوکی چیرۆکێکی سەبارەت میهرەبانی پێشەوامان موحەمەد (د.خ) بۆ شیرینی کچی گێرایەوە ، ئەویش لەگەڵ شاهۆی برای کردیانە پەیڤینێك بەم شێوەیەی خوارەوە:

شیرین : زۆر جار هەردوو نەوەی پێغەمبەر (د.خ) حەسەن و حوسێن کە منداڵ بوون ، لە کاتی نوێژی باپیریان موحەمەد (د.خ) دەچوونە سەر ملی پیرۆزی و لەسەر پشتی یارییان دەکرد ، پێشەواش دڵی نەدەهات ئازاریان بدات ، هەڵنەدەستایەوە تا خۆیان دەهاتنە خوارەوە . دوای نوێژەکەش هەردووکیانی لە باوەشی توند دەکرد و دەیفەرمو (ئەوەی منی خۆش دەوێ با ئەو دوانەشی خۆشبوێ) . شاهۆ گیان ، تۆ لە ماڵ نەبووی کە باوکم ئەم باسەی بۆ گێڕامەوە . شاهۆ گوتی : ئەم کارەی پێغەمبەر (د.خ) زۆر گەورەو ناوازەیە ، نیشانەی میهرو سۆزی زۆرو ، هەستێکی پیرۆزە.

شیرین : ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەر (د.خ) وانەیەکی گرنگە بۆ سەرجەم گەورەکان کەتوڕە نەبن لە بچوکەکان و هەوڵبدەن وەك باوك و دایك و مام و خاڵ بن بۆیان.

شاهۆ : بێگومان وایە . ئێمەش لە ماڵەوە کاری وا ناکەین گەورەکانمان بێزار بکەین هەروەها لە قوتابخانەش دڵی مامۆستایان و کارمەندان ئازار نادەین . رێز لە یاساکانی قوتابخانەش دەگرین.

شیرین گوتی: ئەزانی ئەگەر وابین لە ماڵیشەوە لای باوك و دایك و گەورەکانی دیکە خۆشەویستتر دەبین.

شاهۆ : هیوادارم هەموو پێکەوە بە خۆشی بژین.



## چەند پرسیارێك:

شیرین چی لە باوکی بیست بوو؟

ئەم دوو رستەی لای راست بگەیەنە بە دێڕی گونجاو لە بەرامبەریاندا:

کاتێك پێغەمبەر (د.خ) دەچووە سوژدە............لە باوەشی دایدەنان.

کە لە نوێژ دەبۆوە.............. حەسەن و حوسێن دەچونە سەر ملی و پشتی.

سۆزی پێغەمبەر بەرانبەر منداڵان چۆن مەزەندە دەکەن ؟

کەسێکی دیکەت دیوە میهرەبان بوبێت بەرانبەر منداڵان ؟ چۆن دەیسەلمێنی؟

ئەو کەسەی منداڵی خۆی لە ئامێز نەگرێ و نەیلاوێنێتەوە ، کارێکی باش دەکات؟



## نەرمو نیانی پێغەمبەر (د.خ)

لە سەردانێکی کتێبخانەی گشتیدا هەریەك لە زانا و توانا پەرتوکێکی دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ) وەرگرت و، ئەم وتو وێژەیان لەسەر کرد:

زانا : چیرۆکی ئەو دەشتەکیەی چوە ناو مزگەوتی پێغەمبەر و کاردانەوەی بە ئارامییەکەی پێغەمبەر (د.خ) بەرانبەری، زۆر سەرنجی راکێشاوم.

توانا زۆر بەپەلە : ئەو چیرۆکە چییە ؟ بۆم باس بکە.

زانا گوتی : رۆژێك پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) چوە مزگەوتەوە ، عەبایەکی ئەستووری بەسەر شانەوە بوو ، پیاوێکی دەشتەکی پێی بە چمکی عەباکەیدا ناو رایکێشا بە شێوەیەك ئازار بە ملی سەروەر گەیشت ، کابرا لە جیاتی پۆزشکردن داوای هەندێك پارەی لێکرد ، ئەویش بە زەردە خەنە یەکەوە فەرمووی (بەشی بدەن) .

توانا گوتی: ئارامگرتنی سەروەر لەم رووداوەدا لە لوتکە دابووە ، ئەو پیاوە چۆن سنوری ئەدەبی بەرانبەر پێشەوا بەزاند ، ئای لەو بێشەرمیە .

پاشان گوتی :زانا منیش بەسەرهاتێکی ترم سەبارەت سەروەر خوێندەوە هاوشێوەی ئەو ئارامیەی بەرانبەر کەسێکی دیکەی نەزان. زانا بە پەرۆشەوە ، ئا دەی هاورێی خۆشەویستم مەوەستە، بیگێرەوە.

توانا: کەسێکی دەشتەکی هاتە ناو مزگەوتەکەو لە گۆشەیەکدا میزی کرد، هاوەڵان هاواریان لێکرد : نەکەی ، مزگەوتەکە پیس بکەیت ، پێغەمبەر کە زانی پیاوەکە نە شارەزایە و زۆری بۆ هاتووە ، فەرموی : پێی مەبڕن ، با لێبێتەوە ، پاشان ، فەرموی: ئاو بە شوێنەکەیدا بکەن پاك دەبێتەوە . بە دەشتەکیەکەشی گوت : (( بزانە ، ئێرە مزگەوتە و پێویستە پاکژ راگیرێ ، چونکە شوێنی نوێژ و قورئان خوێندن و زیکری خوایە)) بەم ئارامیەی سەروەرمان کێشەکە کۆتایی هات و عەرەبە دەشتەکیەکەش وانەیەکی ئەدەبی وەرگرت.



## چەند پرسیارێك

ئ – زانا و توانا بۆ کوێ چون ؟ چییان کرد؟

ب– چ بابەتێکی ناو پەڕتوکوکە ، سەرنجی زانای راکێشا؟

پ– پیاوە دەشتەکیەکەی یەکەم چ کارێکی هەڵەی ئەنجامدا؟

ت– کاردانەوەی پێغەمبەر (د.خ) بەرانبەر هەڵەکە چۆن بوو؟

### - خۆم لەسەر ئارامگیری رادەهێنم:

ئ – ئەگەر هاورێیەکم وتەی ناشیرینی پێگوتم، بە جوانی وەلأمی دەدەمەوە.

ب– ئەگەر کەسێك لە کاتی دانیشتن یان لە ناو ئۆتۆمبێل یاخود لە بازاردا بەرمکەوت و ئازارم پێگەیشت، لێی تورە نابم.

پ– گەر ناسیاوێکم بەلامدا تێپەری و سلأوی لێنەکردم، لێی زویر نابم.

ت– بەرانبەر ئەو قوتابییەی بەوشەی نابەجێ دێتە قسە لەگەڵم ، کاردانەوەی هەڵەم نابێت.

ج– کاردانەوەی هاوشێوە نانوێنم بەرانبەر کەسێك بەرد بە شوشەی پەنجەرەکەمدا دەکێشێت.

### چالاکی:

مامۆستا داوا لە قوتابیان دەکات گەر کەسێکیان بەرانبەر هەڵەی یەکێکی دیکە ئارامی گرتووە و کاردانەوەی هاوشێوەی نەبووە ، بۆ هاورێکانی باس بکات.



# دەستکراوەیی ( بەخشندەیی ) ناوازە

زرنگ بە بابانی برای گوت : ئەمشەو سەبارەت بە بەخشندەیی چیرۆکێکم خوێندەوە بابان داوای لێکرد، بۆی بگێڕێتەوە.

زرنگ : لە چیرۆکەکەدا هاتووە ، عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف فەرمودەیەکی پێغەمبەری بیستووە سەبارەت بە بەخشینی پارە ، بۆیە یەکسەر هاتە لای پێغەمبەر (د.خ) پێی گوت: چوار هەزار درهەمم هەیە ، وا دوو هەزاری لە ڕێی خوا دەبەخشم و ئەو نیوەی تر بۆ خێزانەکەم هەڵدەگرم ، پێغەمبەر (د.خ) فەرموی : ( خوا لێت وەرگرێت و بۆت زیاتر بکات ، کارێکی پیرۆزت ئەنجامداوە).

بابان گوتی: منیش سەبارەت بە بەخشندەیی ، پێشبرکێیەکم خوێندەوە کە لە نێوان عومەری کوری خەتاب و ئەبوبەکری سیدیقدا بووە . زرنگ : دەی مەوەستە بۆم بگێرەوە؟

بابان : عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕێتەوە ، جارێکیان پێغەمبەر (د.خ) فەرمانی کرد لە سامانەکەمان ببەخشین ، منیش ویستم پێش ئەبوبەکر بکەوم ، بۆیە نیوەی سامانی خۆم هێنایە خزمەت پێشەوا ، ئەویش لێی پرسیم چەندت بۆ خێزانەکەت گلداوەتەوە ، منیش گوتم ئەوەندەی کە هێناومە . پاشان ئەبو بەکر هەموو سامانەکەی هێنا ، کە سەروەر لێی پرسی ، ئەی چیت بۆ منداڵەکانت داناوە ، گوتی خواو پێغەمبەرەکەی.

عومەریش گوتی : لەمەشدا هەر ئەبو بەکر پێشم کەوت.

لێرەدا نازی خوشکیان کە گوێی گرتبوو، گوتی: منیش هەر سەبارەت دەستکراوەیی باسێکم خوێندۆتەوە ، بۆتان دەگێڕمەوە ، ئەوانیش گوێیان گرت ، گوتی : ئەبی تەڵحە باخێکی گەورەی لە دارخورما لە نزیك مزگەوتێکی مەدینە هەبوو کە خۆشەویسترین باخە لە نێو باخەکانیدا ، کاتێك بیستی ئایەتی : (لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) دابەزیوە ، چووە خزمەت پێغەمبەر پێی گوت: وا ئەو باخە خورمایەم بەخودا بەخشی دوعام بۆ بکە خودا لێم وەرگرێ و پاشەکەوتی بکات بۆ رۆژی دواییم. پێغەمبەر فەرموی :((بخ ذلك مال رابح ، ذلك مال رابح )).

## پرسیار

١-

ئ- لە سەرەتای چیرۆکەکەوە زرنگ چی بە بابانی برای گوت؟

ب- عەبدولرەحمان کوری عەوف چوار هەزار درهەمەکەی چۆن دابەشکرد.

پ- پێغەمبەری خوا (د.خ) لە بەرانبەر ئەو بەخشندەییەی عەبدولرەحمان چی فەرمو؟

٢- وەڵامی راست لە نێو کەوانەکاندا بەرانبەر رستەکان هەڵبژێرە:

ئ- عومەر گوتی: پێغەمبەر (د.خ) رۆژێك فەرمانی کرد (ببەخشین، نوێژبکەین).

ب- دیسان عومەر گوتی: منیش (نیوەی سامانەکەم -هەموو سامانەکەم) هێنا بۆ بەخشین.

پ- ئەبوبەکر (هەمو دەرامەتی-هەندێك لە دەرامەتەکەی) هێنا.

٣- خۆم رادەهێنم کە:

ئ- گەر هاورێیەکم داوای پێنوسەکەمی کرد، پێنووسەکەمی پێدەدەم تا نووسینەکەی تەواو دەکات.

ب- گەر لەسەفەر گەڕامەوە ، دیاری دێنم بۆ هاورێیان و کەس و کار.

پ- ئەگەر لە جێیەکی بچوك لەگەڵ کۆمەڵێك بوم کەس ئازار نادەم و لە خوارەوە دادەنیشم.



## وانەی سێزدەم

### سەعد کوری ئەبی وەقاس( ر.خ )

### نموونەی باوەڕداری بەهێزو پتەو



زانایەکی ئایینی لە کۆڕێکی مزگەوتدا بە نوێژ کەرانی گوت: پلەکانی باوەڕ (ئیمان) لە دڵی موسڵماناندا یەك نییە، کەسی وا هەیە باوەڕی لاوازە و پشتی پیێ نابەستریێ لە نێو کۆمەڵەدا دوو گەنج دانیشتبون بە ناوی (وریا و شاباز) دوای وتەکانی مامۆستا.

**وریا گوتی** : بەشی یەکەم لە موسڵمانان ئەوانەن کە لەسەر ڕێبازی هیدایەتن و بەردەوامن ، هیوادارم خوا ئێمەش لەو ریزەدا هەژمار بکات.

**شاباز گوتی** : منیش جارێك لە زانایەکی ترم بیست بەسەر هاتی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسی) دەگێرایەوە کاتێك باوەڕی بە ئایینی نوێی ( ئیسلام) هێنابوو ، چۆن دایکی مانی لە خواردن گرت تا پاشگەز بێتەوەو بچێتەوە سەر بیروباوەڕی باو باپیرانی کە بت پەرستی بوو ، بەسەر هاتەکەش وەك لای خوارەوە بوو :

سەعد دەڵێت : زۆر لەگەڵ دایکم باش بووم ، کە باوەڕم بە ئایینی ئیسلام هێنا.

دایکم گوتی : کوڕم کارێکی خراپت کرد ، دەبیێ بگەڕێیتەوە سەر ئایینی باپیرانت یان دەست لە خواردن هەڵدەگرم تا دەمرم و بۆ تۆش نەنگی دەبێت و ئابروت دەچێت.

سەعد دەڵێت: منیش پێم گوت دایە ، ئەو کارە مەکە .چونکە من بە هیچ نرخێك ئامادەنیم دەست لە ئایینی ئیسلام هەڵگرم ، بەڵام دایکی سەعد شەو رۆژێك هیچی نەخوارد و باری تەندروستی تێکچوو.

سەعد دووبارە گوتی : دایە گیان وازبێنە ئەگەر هەزار گیانت هەبێ و یەك لە دوای یەك دەربچن لە جەستەت ، من واز لە ئیسلام ناهێنم ، بۆیە دایکی لەوە گەیشت سودی نییە ، دەستی بە خواردن و خواردنەوە کردەوە.

پاشان ئەم ئایەتانە دابەزین:((وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾)) (لقمان ١٤-١٥).



## چەند پرسیارێك دەربارەی باسەکە

١-

ئ- زاناکە سەبارەت بە چی باسی  بۆ نوێژ کەر دەکرد؟

ب- ئەو دوو گەنجە کێ بوون لە نێوان نوێژ کەراندا.

پ- وریا نزای بۆ چی کرد دوای ئامۆژگاریەکانی زاناکە؟

ت- ئەو ئایەتە کامەیە دوای مشت و مڕی سەعد و دایکی هاتە خوارەوە؟

٢- ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو لە بابەتەکە ، پڕبکەوە:

ئ- شاباز گوتی : منیش لە زانایەکم بیست بەسەرهاتی ..................دەگێرایەوە.

ب- کاتێك دایکی بە ئیسلام بوونی سەعدی زانی بڕیاریدا................. .

پ- سەعد گوتی : دایە ، خۆت ماندو مەکە ، تازە من واز لە............... .

## خۆم تاقی دەکەمەوە:

ئ- هاوکاری هاوڕێکانم دەکەم گەر بۆ کارێکی چاك کۆبوونەوە.

ب- ئەگەر توڕە بووم قسەیەك ناکەم خودام لێ توڕە بکات.

## سورەتی تەکاسور (التَّكاثُر)

بسم الله الرحمن الرحيم

(( أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ① حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ② كَلَّا سَوْفَ
تَعْلَمُونَ [③] ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ④ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ
الْيَقِينِ ⑤ لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ ⑥ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ⑦ ثُمَّ
لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ⑧ ))

صدق الله العظيم

راڤە :

((أَلۡهَاكُمُ التَّكَاثُرُ)) شانازیتان بە فرەیی (ماڵ و منداڵ) ئێوەی بەخۆیەوە خەریك كرد.

((حَتَّىٰ زُرۡتُمُ الۡمَقَابِرَ))تا هەمووتان دەچنە گۆڕستان.

((كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ)) زۆر ناخایەنێ تێدەگەن.

((ثُمَّ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ)) جارێ تریش زۆر ناخایەنێ تێدەگەن.

((كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ الۡيَقِينِ)) بەڵام ئەگەر راستەقینەتان بزانیبا.

((لَتَرَوُنَّ الۡجَحِيمَ)) ئاشكرا دۆزەختان دەدی.

((ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ الۡيَقِينِ)) دیسان، هەر بە ئاشكرا بەچاوی سەر دەتاندی.

((ثُمَّ لَتُسۡأَلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ)) لە رۆژی زیندوو بونەوەدا دەربارەی خۆشی دونیا لێتان دەپرسن.

گفتوگۆ:

- چی مرۆڤ لە پەرستش و زیكری خودا دوور دەخاتەوە؟
- ئایە خودا پرسیار لە بەندەكانی دەكات لەو خۆشییانەی تێدا بوون؟



## ئەبو عوبەیدەی دەستپاك (ر.خ)

دوانەی دەستپاکی و بەهێزی ، خاوەنەکەیان دەرازێننەوە ، بە دەستپاکیەکەی هەموان دوور دەبن لە زیان و ستەم هێزەکەشی فاکتەری پاراستنی ئەو سپاردەیەیە بە هەدەر ناچێت و بە کەسیش نافەوتێت.

دایکی ریژوان شەوێك تەماشای زنجیرەیەکی تەلەفزیۆنی دەکرد کە دەربارەی هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) بوو بە ناوی (ئەبو عوبەیدەی جەراح) ، بە هودای کچی گوت نزیك بەرەوە با بەسەرهاتی ئەو هاوەڵە بەرێزەت بۆ باس بکەم.

کچەکەی هاتە پێشەوە ، گوتی : دایە گیان من زۆر پەرۆشی گوێبیستی بەسەرهاتی هاوەڵانی بەرێزیپێغەمبەرم (د.خ).

دایکی گوتی : من زۆر شاد و بەختەوەرم کە کچەکەم دەبینم لە ژیانی سەروەرمان و هاوەڵانی دەکۆڵێتەوە ، تەمەنت درێژبێ کچم . جا گوێبگرە بۆ ئەم باسە گرنگە ، شاندێکی کریستیانەکانی (نەجران) هاتنە لای پێغەمبەر (د.خ) ئەوەش دوای خستنە رووی باسێکی چڕ و پڕی ئیسلام ، ئەوانیش خوازیاری ناردنی هاوەڵێك بوون لەگەڵیان کە دەستپاك و بەهێزبێت و ببێتە فەرماندار لە ناویاندا کاری کۆمەڵگەکەیان رێکبخات . پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی شەو سەردانم بکەن کەسێکی شیاو دیاری دەکەم لەگەڵتان بێت .

وە چاوەڕێی کرد تا ئەبو عوبەیدە هات ، ئینجا پێی فەرموو : لەگەڵیان برۆ و دادوەری لە نێوانیاندا بکە بەشێوەیەك خوا پێی رازی بێت . ئەبو عوبەیدە ئەو هاوەڵە بوو کە پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی دەیفەرموو : ( هەموو نەتەوەیەك کەسێکی رازگری تیایە ، رازگری ئەم نەتەوەش ، ئەبو عوبەیدەیە).

کچەکەی گوتی : سوپاس دایە گیان . زانیارییەکی گرنگ بوو ، بەم باسەت زیاتر شارەزا بووم لە ژیاننامەی هاوەڵان ، بە تایبەت ئەبو عوبەیدە (خ.ر) . بۆیە دایکی گوتی : لە ئێستا بە دواوە ، بە بەردەوامی چیرۆك و ژیاننامەی هاوەڵانت بۆ دەگێڕمەوە ، تا سودیان لێ وەرگری و هەردوولاشمان پاداشتی خوایی وەرگرین.

## پرسیار دەربارەی باسەکە

١-

ئ- سپاردە و دەستپاکی لە مرۆڤدا ، واتای چییە؟

ب- ئەی بەهێزی چی دەگەیەنێ؟

پ- ناوی ئەو هاوەڵە چییە ، دایکی ڕێژوان لە زنجیرە تەلەفزیۆنەکەیدا تەماشای ژیاننامەی دەکرد.

٢- وەڵامی ڕاست لە نێوان کەوانەکاندا دیاری بکە:

ئـ- هەموو نەتەوەیەك ڕازگرێکی هەیە ، ڕازگری ئەم نەتەوەیە ( زەیدی کوری سابتە ، ئەبو عوبەیدەی جەراحە).

ب- پێغەمبەر فەرموی : بڕۆ لەگەڵیان و دادوەریان بکە لەوەدا کە (کۆکن ، ناکۆکن) لەسەری.

٣- خۆم ڕادەهێنم:

ئ- ئەگەر لەخۆم دڵنیا بووم لە ئەرکێکدا کە پێم دەکرێت ، هەوڵی بەجێهێنانی دەدەم تا لەو ڕێیەوە خزمەتێك بە وڵاتەکەم بکەم.

ب- دەست لە کارێك وەرنادەم کە توانام بەسەریدا نەشکێ و شارەزا نەبم.

## چالاکی

لە پۆلەکەدا ، مامۆستا قوتابییەکی دەستپاك و خاوەن کەسێتی بەهێز دەست نیشان دەکات ، کە ڕۆڵی مرۆڤێکی ڕازگر بگێرێت و هەڵوێست بنوێنێ لەبەر چاوی هاوڕێیانی.



# خۆنەویستی پیاوێك لە پشتیوانان



لە شیو خواردنێکدا ، خێزانەکەی بەختیار کۆبووەوە ، پاش نانخواردن وسوپاسکردنی خوا لەسەر بەخششەکانی ، بەختیاری باوك گوتی : ئەگەر ئێستا کەسێکی برسی بە گوزەرەکەماندا تێپەری هەڵوێستمان دەبێ چۆن بێ ؟ پاشان چیرۆکی پیاوێکی لە پشتیوانان بۆ گێڕانەوە بەم شێوەیە :

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (د.خ) و پێی گوت : ئەی نێردراوی خوا ، زۆرم برسییە و ماندوم. دەستبەجێ سەروەر ناردی بۆ لای خێزانەکانی ئەگەر خۆراکیان لایە ؟ هەموو وەڵامیان دەناردەوە کە ، سوێند بەخوا ، جگە لە ئاو هیچ لە ماڵماندا نییە . پاشان پێغەمبەر (د.خ) توویکردە چەند هاوەڵێك و فەرموی کامتان دەتوانێت ئەمشەو میوانداری لەم رێبوارە بکات و تێری بکات ؟ یەکێك لە پشتیوانان (واتە خەڵکی شاری مەدینە ) هەستا ، گوتی : من ئامادەم ، دەیبەمەوە ماڵی خۆم . کە گەیشتنە ماڵەوە ، هاوەڵەکە لە هاوسەرەکەی پرسی ، چیمان هەیە بۆ ئەم میوانە بیخوات؟ ژنەکەی گوتی : تەنها ئەوەندە هەیە کەمێك برسییێتی منداڵەکان بشکێنێ . ئەویش گوتی : منداڵەکان بە شتێکەوە سەرقاڵ بکە ، ئەگەر داوای خواردنیان کرد هەوڵبدە بیانخەوێنی ، کە

میوانەکەش هاتە ژوریٚ چرایەکە بکوژێنەوە تا وا هەست بکات من لەگەڵی دەخۆم ، بەم نەخشەیە میوانەکەیان تێرکرد بیٚ ئەوەی هەست بەهیچ بکات.کە بەیانی پێغەمبەرمان (د.خ) بینی ، پێی فەرمو : خوای گەورە زۆری پیٚ خۆشبوو ئەو کارەتان نواندبوو لەگەڵ میوانەکەتان لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : (( وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ )) (الحشر٩).

واتە : ئەوانە ، خەڵك پێش خۆیان دەخەن ، هەر چەندە خۆشیان ئاتاجن. بۆیە کورە گەورەکەی بەختیار ، گوتی : بەراستی ئەو هاوەڵە نموونەی بەخشندەیی بەزەیی و میوانداری بوو ، پلانێکی جوان و شایستەی بەکارهێنا تا میوانەکە هەست بە راستی رووداوەکە نەکات و ، ئەوی پێش خۆیان خست لە تێرکردندا.

باوکیان گوتی : کۆمەڵگەی مرۆیی نموونەی لەم شێوەیەی زۆر تێدایە لە مرۆڤی بە بەزەیی و خوا ناس کە وەك مۆم دەتوێتەوە بۆ بەرژەوەندی کەسانی دیکە . شێرزاد کە کورە هەرە بچوکەکەیان بوو ، گوتی : من ئامادەم هەر کاتێك هەژارێکم بینی بەشە خۆراکی بدەمیٚ . باوکیان زۆر شادمان بوو بە هەڵوێستی منداڵەکانی و گوتی : خوا بە سۆز و میهری خۆی چاودێریتان بکات ، بە راستی زۆر بە بەزەیی و دڵنەرمن.



## پرسیار دەربارەی دەقەکە

١-

ئ- خێزانی بەختیار لە دەوری چی کۆ ببوونەوە؟

ب- بەختیار چی بە مێشکدا هات ، دوای لێبونەوەیان لە خواردنی شێو؟

پ- بەختیار چی بە منداڵەکانی گوت؟

ت- هاوەڵە یاریدەدەرەکە چۆن شەویان ڕۆژکردەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی؟

ج- هاوەڵەکە چ کارێکی کرد تا میوانەکە وا هەست بکات خۆشی نانی لەگەڵ دەخوا.

٢- وەڵامی ڕاست لە نێو کەوانەکاندا بۆ ئەم ڕستانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

ئ- خێزانەکەی پێغەمبەر (د.خ) وتی : سوێند بەخوا (خۆراکێکی خۆشمان هەیە ، هیچمان نییە جگە لە ئاو).

ب- پێغەمبەری خوا (د.خ) وەك (دەوڵەمەندێکی بێ باك ، هەژارێکی بە قەناعەت) دەژیا.

پ- هاوەڵە یاریدەدەرەکە بە هاوسەرەکەی گوت : چیمان هەیە ؟ گوتی هیچمان نییە جگە لە (کەمێك خۆراك بۆ منداڵەکان ، خۆراك بۆ براکانم).

## ڕاهێنان

ئ- دوای خوێندنەوەی دەقەکە بۆم دەرکەوت کە گیانی بەخشین لە زۆر کەسدا هەیە با هەژاریش بن.

ب- پێم خۆشە شوێن پێی پشتیوانەکە هەڵگرم لە بەخشین و پێش خستنی خەڵك.

پ- لەخۆم ڕادەبینم هاوکاری نەبوو بکەم و کەمتەرخەم نەبم لە بەدەمەوە چوونیان.

٤- لەم وشانەی خوارەوە ڕستەکە ڕێکخەوە:

میوانەکەمان ، ئەگەر ، چراکە ، هاتە ژوورەوە ، بکوژێنەوە .

## سورەتی تین

### بسم الله الرحمن الرحيم

(( وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدْ
خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ﴿٥﴾
إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا
يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴿٨﴾ ))

صدق الله العظيم



**راڤه:**

((وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)) سوێند به هەژیر*، به زەیتونیش .

((وَطُورِ سِينِينَ)) سوێندیش به توری سینایه (ئەو چیایەی خودای گەورە لە گەڵ پێغەمبەری خۆی موسا قسەی کردو بووه هۆی ئەوەی ئەم شوێنە پێگەو پیرۆزییەکی هەبێت). ((وَهَذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ )) بەم بازێرەش** کە مەترسی لەسەر نییە (مەبەست شاری مەککەیە).((لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ)) ئێمە مرۆڤمان لە ڕێکترین شێوەدا وەدی هێناوە.

((ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ)) پاشان گێڕاومانەتەوە بۆ پلەی هەرە بەرە ژێر گەر ڕێبازی خودا نەگرێت.

((إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ )) جگە لە ئەوانەی باوەڕدارو ئاکار چاك بوون، کە پاداشیان دوایی نایێ.

((فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ)) سا ئەی مرۆڤ چی تۆی دەسخەڕۆ کردووە کە ڕۆژی دواییت پێ درۆیە؟

((أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ)) ئاخۆ خودا دادگەرترین فەرمانڕەوا نییە؟

---

* **هەژیر:** هەنجیر

** **بازێر:** شار

**گفتوگۆ:**

- بۆچی خودا سوێندبە (التین والزیتون) دەخوات؟

- بۆچی پێگەی چیای (طور) لە نێو خەڵکیدا بەرزو پیرۆزە.



# ناوەڕۆك